

ئاسمان
منم شەو؛
هیچ پەنایەکی ترمان نیە...

شێنێ کەمال

## (ئەم ئاسمانە)



له باوەشیەوە چوار خشتەک لە شەوی پوخت بەر دەبنەوە
وە دەیدەن بە سنگمدا گەر لەژێریدا ڕابکشێم.
ئەم ئاسمانە کە من هەڵمنەبژاردووە
ئەم ئاسمانە کە ئەستێرەکانی ڕقیانە لێم
ئەم ئاسمانەی کە وا بە کۆڵی منەوە:
هەورە گەمژەکانی قاقا پێدەکەنن پێم
دەترسن لەو هەموو مردنەی وا لەژێر نینۆکەکانمدا
پێدەکەنن بەو هەموو پووچییەی من دەیژمێرم لە پێچەکانی مێزەرەکەی سەری خوادا؛
قینیشیان لەو بارانە هەڵساوە کە تەنیا بە من دەبارێندرێت، نەک بەوان.

**بە برینەوە مرۆڤ ناچار کرا بەژێریدا بڕوات، بە یادەوەرییەوە هەموومان ناچار کراین لەژێریدا بمرین. <ئەم ئاسمانە>**

وەک تەمی ژێـــر پێســـتە شـــینەکەی خۆڵەمێشـــیوەک تەمی ژێـــر پێســـتە شـــینەکەی قـــورس<هـــێی ئەم ئاســـمانە> ڕۆح دێـــت و دوایـــین ســـەروای خـــۆی بـــۆ لەشـــم دەدرکێنێـــت /کە دەمـــرم/. وەک کوردێـــک، /کە تەنهـــا مـــنم/ لەژێـــر شـــینایی پێســـتەکەیدا، /هـــێی ئەم ئاســـمانە/ چـــارەنووس عەبەســـیترین پـــێڕی نـــاو دەستی دادەکاتە سەر ئەو مێزەی من و چیاکان قوماری لەدایکبوونی خۆمانمان لەسەر دەکرد.

بەڵام؛
سەرباری هەمووی
باکم نییە کە سەر بە خەڵکم
باکم نییە کە پێوەندی ئەو پەرییانەم کە؛ لەوسەری خوانەکەوە دەستیان دەبرد و
لە زێیانەوە ڕەحمی خۆیان دەردەهێنا، تا مریەمییانە مڵچ مڵچ بیخۆن <مڵچ مڵچ دەشیانخوارد>
باکم نییە کە ڕەخنەگرانی ئەقڵی یەکەمن کرێشی نێوان پەڕی نادیاری شاباڵە هەتاوییەکانم
باکم نییە کە شەش جووت مەمکن لەناو سەبەتەی میوەجاتی دەست ژنانی شەو و ژنانی ڕۆژدا کە بە جووتێک کەوشی بنبەرزەوە ڕەدووی باوکەکانیان دەکەون
باکم نییە کە دەروازەکانی حەقیەت بە ڕوومدا ناکرێنەوە
باکم نییە بەو باغانە و بەو عەرشانەی دەبمە بوومەلەرزەیان
باکم نییە کە کرامە جەللادی مانا
باکم نییە کە فەقێیەکانی تێگەیشتن جامەدانەکانیان کورت دەهێنێت بۆ پێچانی ئەم ئاوەزە
باکم نییە کە هەر پارچەیەکم لە بیابانێکدا خەون دەبینێت





شەپۆل شەپۆل لە سینەمدا زوڵمەت خۆی دەدات بەسەر خۆیدا
قەینا؛ لرفەم لە خۆم ناتۆرێنم
ئەسپەکانی ئاهم هەر وا بە گۆڕەپانی کارەساتەکەدا با غارغارێنیان بێت
سەراب دوای سەراب بینابیم دیمەنەکە دەخاتە ژێر باڵە ماندووەکانیەوە
قەینا؛ من لە بەردەم پەنجەرەی خۆمدام.
ئەم کۆنەفرۆشانەی درۆ جیرەجیری گالیسکە شەلەکانیان ڕۆژێک هەر تەواو دەبێت
ئەم پینەچییانەی ئازار دڵی منیان پێ تەقەڵرێژ ناکرێت.
ڕۆژێک یەزدان بوکەڵەکانی کۆدەکاتەوە و دەڵێت با دەستپێبکەینەوە، قەینا:
منم جیهان، کە دووبارەبوونەوەی خۆمم.

**لە هۆدەکەی خۆمدا خەریکم لە خۆم و بوونەوەرەکانم دەڕوانم**
لە پەنجەرەکەی منەوە گەردوون هەناوی دیارە:
دارتوویەک کە چڵ بە چڵی خۆی لە ژیان گیر دەکات، گەڵا گەڵا ختووکەی ژیان دەدات
بێدەنگی کە لەوێ ڕاوەستاوە
خەون و ئازار کە لەوێ ڕاوەستاون؛
تاریکی کە دەستاودەستی عەدەم دێت و دەچێت
بەرمیلێکی ژەنگاوی کە پڕە لە یادەوەریی شل
مەستی کە بەسەر ژنێکی گومڕادا دەڕشێتەوە
هەشت ئەبولهەولی سوور کە گەدەی هەریەکێکیان زەمزەمی هاجەرێکە
دێرێک دێڕ نییە لە ژێر پێی منەوە هەڵنەقوڵێت؛
منم جوبریل، پێم بەم وشکەڵانەدا دەکوتم.

**گڵۆپێکی زەردی گەردن نەوی کە تا سبەی گۆرانی بۆ ئیشقی تیشکێکی قەحبە دەچڕێت.**

چەندەها بەرد کە تەنیا بەردن؛
قیر کە لە گەیشتنندا گەووادی ڕێگایە
دوازدە وشە و دوو پیت کە بەو ناوەدا ڕاکەڕاکیانە و پێیان لەم دێڕە گیر دەبێت
قەفەسێکی سەوز و کەڵەشێرێک لە ناویدا
کە هەرکات شیعرێکی خراپی دی پڕ بە گەرووی کفر دەقووقێنێت،
خەمۆکی کە هەر نیو سەعات جارێک دێت و جگەرەیەک لە پاکەتەکەی من دەدزێت
کەڵەکێک داری ئەستوور کە خۆیان وشک کردووەتەوە و چاوەڕێی قەدەری خۆیانن
خورپە کە وێنەی دەیان کۆنەیاری بەدەستەوەیە و هەرجارێک یەکێکیان بە ڕوومدا هەڵدەبڕێت،
ڕێبوار کە بە دوای ڕێگادا دەگەڕێن، خەڵک کە لە نزماییانەوە بەحاڵ دیارن <قەینا>
با ڕوانین لە بەرزاییەوە ڕوانین بێت لە کوێراییەوە

**منم کوێری هەر حەوت ئاسمان**
وایەرێکی ئەستوور کە لەوسەریەوە بزنەکێوییەک لە دۆزەخ دەست بە مەمکی خۆیدا دەهێنێت و لەگەڵ هەر ئۆرگازمێکیدا تەزوویەک بە یەخچاڵەکەی من دەگات؛
کۆترێکی پیر بەسەر وایەرەکەوە، سنگی پڕە لە هاواری نێو ئەفسانەکان
ئومێد کە لەگەڵ شکست و ڕووخاندا فیکلانکۆیەتی
سێ پشیلە کە کلکیان دەجووڵێنن وەک کلکی شاعیران.
**زۆر دەبینم لە پەنجەرەکەی خۆمەوە:**

دەیــان پێغەمــبەر، بە دیــواری بەردیــنی باڵەخــانە زەردەکەدا هەڵــدەزنێن و لەو کــارگە زەردەی پشــتی کــردووەتە سەرخۆشــەکانی ئەزمەڕ، پــــڕ بە گیرفانیـــان تـــووتن دەدزن؛دەیـــان خـــودا، جنـــۆکە و فریشـــتەکانیان کـــۆدەکەنەوە و لە گۆڕەپـــانی سێگۆشـــەیی بەر پەنجەرەکەمـــدا، بە کـــاڵە و فـــانیلەی سـپییەوە، ئۆلۆمپیادێـک ڕێکـدەخەن بـۆ هەڵـبژاردنی عەبەسـترین یـاریزانی مەلەکـووت؛ دەیـان شـەیتان کە لەســەر دیوارەکــان دانیشــتوون و قاچیانیــان شــۆڕ کــردووەتەوە، تەماشــای ئۆلۆمپیــادەکە دەکەن و جــار جــاریش بە خەنــدەوە دەســتێک بــۆ مــن ڕادەوەشــێنن؛ ســەدان پاشــا کە خۆپیشــاندانیانە چــون لە نەتەوەکانیــان بــێزارن؛ ســەدان ئاشــق کە هەمــوو شــەوێک کــۆدەبنەوە و مەزادێــک بــۆ فرۆشــتنی خــۆڕاگرترین دڵ ڕێکــدەخەن؛ هەزاران شــەهید کە لە بنــدیوار و قوژبنەکانــدا بــۆ تەرمەکــانی خۆیــان دەگەڕێن؛ /قەینا...

**منم ڕۆستەم، دێوەکانم ماڵی کردوون.**

زۆر دەبینم لە پەنجەرەکەی خۆمەوە:
هاوڕێکانی خۆم دەبینم کە تەنیا هاوڕێی یەکترن؛ قەینا...
هاوڕێ تووڵەڕێیەکە دەچێتەوە سەر قەرەباڵغی
قەیسەریی شاعیرانی ئەمڕۆ وا لەسەر ئەو تووڵەڕێیە؛ قەینا...
حاشا لە تووڵەڕێ و غەڵبەغەڵبی نێو بازاڕی شاعیران.
زۆر دەبینم لە پەنجەرەکەی خۆمەوە:
یارەکانی خۆم دەبینم کە هیچیان من ناناسنەوە؛ قەینا...
خۆشەویستی پێوەندییەکی هەڵەیە لەگەڵ جیهاندا
مرۆڤی پاش کارەساتە گەورەکان مرۆڤی تووڕەییە گەورەکانە
مرۆڤی تووڕەییە گەورەکان بە ڕقەوە دەست بۆ جیهان دەبات، قەینا...
منم ڕق، بە نووری مانا دەدرەوشێمەوە.
لە پەنجەرەکەی منەوە گەردوون هەناوی دیارە، قەینا...
شەپۆل شەپۆل لە سینەمدا زوڵمەت خۆی دەدات بەسەر خۆیدا، قەینا...
لرفەم لە خۆم ناتۆرێنم؛
منم شەو، هیچ کەنارێکم نییە.

